# الاصول الثلاثة

## بەکوردی

١ـ خوات کێیە؟

٢ـ دینت چییە؟

٣ـ پێغەمبەرت کێیە؟


نووسینی

شیخ الاسلام محمد بن عبدالوهاب

وەرگێڕانی

نەوا محمد سعید




ناوی کتێب: الاصول الثلاثة بەکوردی
نوسەر: محمد عبدالوهاب
وەرگێڕانی: نەوا محمد سعید
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩٧٩)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی دراوەتێ

تفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com
www.al-tafseer.com

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

خوێنەری بەڕێز: ڕەحمەتی خوات لێ بێ، ئەوە بزانە، ئێمە دەبێ چوار مەسەلە فێربین و بیزانین:

یەکەم: زانست و زانین، کە بریتیە لە ناسینی خوا(الله)و، ناسینی پێغەمبەرەکەی و، ناسینی ئیسلام بە بەڵگەوە.

دووەم: کارکردن بەم زانست و زانینە.

سێیەم: بانگەوازیکردن بۆ ئەم زانستە.

چوارەم: ئارامگرتن لە سەر ئەوشتانەی دەبنە مایەی ئازار لەو ڕێگایە.

بەڵگەی ڕاستی ئەم چوار مەسەلەیەش[1]، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ:

---

[1]ـ بەڵگەی مەسەلەی یەکەم، زانست و زانین بریتیە لە ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ چونکە ئیمان، تەنها بەزانست و زانینەوە دەناسرێ،

﴿وَالْعَصْرِ ۝١ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ۝٣﴾ العصر

**واته: سوێند به ڕۆژگار، که کاتێکه بۆ ژیانی نهوهکان و ههڵسوڕانی کارهکان، بهڕاستی مرۆڤ له تیاچون وماڵوێرانیدایه، گهر بڕوای به خوای به**

---

که بریتیه له ناسینی خوای گهورهو ناسینی پێغهمبهرهکهی ﷺ و، ناسینی دینی ئیسلام به بهڵگهوه، بهڵگهی مهسهلهی دووهم بریتیه له ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ، که ئهمهش کارکردنه به زانستهکه.

بهڵگهی سێیهم بریتیه له: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ﴾، ئهمهش بانگهوازییه بۆ زانست وکردهوه.

بهڵگهی مهسهلهی چوارهم بریتیه له: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ ئارام گرتن لهسهر ئازارو ژان له پێناو بانگهوازیکرن بۆ زانست و کردهوه.

بڕوانه: "جامع شروح الثلاثة الأصول"لجمع من العلماء دارالهيثم القاهرة ودار ابن الجوزي القاهرة - الطبعة الأولى ٢٠٠٧ص٤٠(وهرگێر)

دەسەڵات نەبوو، تەنها ئەو کەسە زەرەر مەندنیە، کە بڕوای بـە خواهێنـا بـێ و شـوێن پێغەمبەرەکـەی کـەوتبێ و، کـردەوەی باشـی ئـەنجام دابـێ و، بڕوادارانیش ئامۆژگاری یەکتری بکەن بەو حەق و ڕاسـتیەی، کـە پـەیامی خـوا هێناویـەتی، هـەروەها ئامۆژگـاری یـەکتر بکـەن بـە ئـارامگرتن لـە سـەر ئەوکارانەی، کە خوا فەرمانی پێکردووە و، وازهێنـان لـەو کارانـەی، کـە خـوا هۆشـداریداوە نـەکرێ و، ڕازیبون بەو بەشەی، کە خوا بۆی داناوە. دەر بارەی گـەورەیی سـوڕەتی (العـصر)، پێـشەوا شـافیعی: گوتویـەتی: (لـو مـا أنـزل الله حجـة علـى خلقـه إلا هـذه الـسورة لَكَفَتْهُم) واتـە: گـەر خـوای گـەورە تـەنها ئـەم سـوڕەتەی بـۆ مرۆڤایـەتی بناردبـا، کـە بکرێتـە پەیڕەوو مەنهەج، ئەوا ئەوەندەیان بەس بوو.

بوخـاریش گوتوویـەتی: زانـست و زانیـن، لـە پێش گوتەو کردەوەیە، بەلگەش فەرمایشتی خوای

بەرزو مەزنە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ... بزانە جگە لە خودا، کەسی دیکە شایەنی پەرستن نییەو، داوای لێخۆشبون بۆ خۆتو موسڵمانان بکە﴾ محمد:١٩

لەم ئایەتەدا زانست و زانینی پێش گوتەو کردەوە(قول و عمل)ی خستوە.

خوێنەری بەڕێز، بەر ڕەحمەتی خوا کەوی، بزانە، پێویستە لە سەر گشت پیاو و ئافرەتی موسڵمان، ئەم سێ مەسەلەیە بزانێ و کاریان پێ بکات:

یەکەم: خوا ئێمەی بەدیهێناوەو، ڕزق و ڕۆزی داوین و، ئێمەی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین؛ هەرکەسێ بەگوێی بکات، دەچێتە بەهەشتەوە، بەڵگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ

رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾... ئێمه پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کرد، تا شایەت بێ بەسەرتانەوە؛ هەروەك بۆ ئالی فیرعەون پێغەمبەرێکمان بەرێ کرد، فیرعەون بەقسەی پێغەمبەرەکەی نەکرد؛ ئەوسا ئێمەش ئازارێکی بەژانمان دا﴾ المزمل ١٥ـ ١٦

دووەم: خوا ڕازی نابێ لە عیبادە تکردن و پەرستنیدا، هیچ کەسێ نە فریشتەی نزیك و نە لە پێغەمبەران بکرێنە هاوبەش، بەڵگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ... مزگەوتەکان ماڵی خودان، لە گەڵ خودا، هاواری کەسی تر مەکەن ﴾ الجن: ١٨

سێیەم: هەرکەسێ بە قسەی پێغەمبەر بکات و خوا بەیەك بزانێ، نا بێ و بۆی دروست نیە

دۆستایەتی و خۆشەویستی بۆ ئەوکەسانە بنوێنی، کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، با ئەو کەسانەش نزیکترین کەس بێت، بەڵگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ ۚ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ....

تۆ نابینی ئەوانەی باوەڕیان هەیە بەخوداو بەڕۆژی سەڵا (قیامەت)، نابێ هەرگیز ببنە دۆستی ئەوکەسانەی پێچەوانەی خوداو پێغەمبەری خودان. تەناتەت ئەگەر باوکیشیان، یان منداڵەکانیان، یان برایان، یان لەهۆزەکەی، خۆیان بن، کە ئەمانە خودا

بڕوای له دڵیان جێگیر کردوه و به هێزێکی جێگیر کردوەو به هێزێکی تایبەتی خۆی یاری کردون؛ دەیان نێرێته باغاتێك، که جۆباریان بەبەردا دەڕوات و هەتا سەر هەر لەوێ دەبن؛ خودایان لێ ڕازی بوەو ئەوانیش له خودا ڕازین. ئەوانه کۆمەڵی خودان؛ باش بزانن هەر کۆمەڵی خوا ڕزگارن﴾ المجادلة:٢٢.

خوێنەری بەڕێز: خوا ڕێنمونیت بکات بۆ تاعەت کردنی خوا، بزانه، که ڕێگای ڕاستی شەریعەتی ئیبراهیم، ئەوەیه که تەنها خوا بپەرستی به پاکژی و لەسەر دینەکەی ئەوبیت! هەر بۆ ئەمەش، خودا فەرمانی بەگشت خەڵکی کردوەو بۆ پەرستنی بەدی هێناون، هەروەك خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ... جنۆکەو ئادەمیزادم، تەنها بۆ پەرستنم بەدیهێناون﴾ الذاريات: ٥٦.

مانـای (یعبـدون) بریتیـە لـەوەی خـوا بـە یـەك بـزانن و هاوبەشـی بـۆ پەیـدا نەکـەن، گـە ورەتـرین شت، کـە خـوا فـەرمانی پێکـردوە یەکخواپەرسـتییە ، بەواتای لە پەرستندا تەنها ئەو بپەرستی.گەورەترین شتیش ، کە خوا قەدەغەی کردووە بکرێ بریتیـە لـە هاوبەش بـۆ خـوا دانـان (الـشرك)، واتـە: لەگـەڵ خـوا هاوارو بانگی شتی دیکە بکات، بەڵگـەش فـەرمودەی خـوای گەورەیـە، کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔاۖ .... خـوا بپەرسـتن و هـیچ شـت مەکەن بەهاوبەش و شەریکی﴾ النساء: ٣٦.

گەر پێیان گوتی: سێ بنەماکـە (الأصـول الثلاثـة) چییە، کە پێویستە مرۆڤ بیزانێ؟

## بنەمای یەکەم : خوا بەدیهێنەرە

بڵێ: دەبێ بەندە، خوای پەروەردگاری بناسێ و ئایینەکەیی و پێغەمبەرەکەی، کە (محمد ﷺ)ە بناسێ، گەر پێت گوترا: پەروەردگارت کێیە؟

بڵێ: پەروەردگاری من، خوا(الله)یە، ئەو خوایەی منی پێگەیاندوەو بە نیعمەتەکانی، هەموو جیهانی پێگەیاندوە، هەر ئەو شایستەی پەرستنی منەو، کەسی دیکەم نییە شایەنی پەرستنم بێت، بەڵگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ... سوپاس بۆ خوا، کە ڕاهێنەرو پەروەردگاری جیهانە﴾ الفاتحة: ٢

هەروەها جگە لە خوا، ئەوا هەموو شتێك جیهانەو بە دیهێنراوە، منیش یەکێکم لەو جیهان و بە دیهێنراوە.

گـەر پێـت گـوترا: بـەچ شـتێك پـەروەردگارت ناسیوە؟

بلـێ: بـە نیـشانەو بەلگـەكانی خـواو، بەدیهێنراوەكانی و، بە نیشانەكانی لـە شـەو و ڕۆژ و خۆر مانگ و، هەروەها بەهەر حەفت ئاسمانـەكانی و حەفت چینی زەوی و ئەوەی تێیدان و لە نێوانیـان دایـە، بەلگـەش فەرمایـشتی خـوای گەورەیـە، كـە دەفـەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ...شەوو ڕۆژ و خۆرو مانگ لە نیشانەكانی ئەون؛ نـە بـەرەو خـۆر سـوژدە بـەرن، نـە بـەرەو مـانگ؛ سـوژدە بـۆ خودایـەك بـەرن، كـە ئـەوانی وەدیهێنـا؛ ئەگـەر هـەر ئەو دەپەرستن ﴾ فصلت: ٣٧.

هەروەها ئایەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ... پەروەردگارتان خودایێکە، کە ئاسمانەکان و زەمینی؛ لە شەش ڕۆژاندا دروستکرد. ئەوجا لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی دامەزرا. ڕۆژی بە شەوی دەپۆشی و ڕۆژیش دەکەوێتە شوێنی شەوێ. خۆرو مانگ و ئەستێرانی بەدیهێناو هەر لە ژێر فەرمانی ئەودان، بەدیهێنان و فەرمان هەر بۆ ئەوە زۆر و زەبەندمیە، پیرۆزی خودایێ، کە پەروەردگاری گشت جیهانە﴾ الأعراف: ٥٤

پەروەردگاریش(الرب) بریتیە لە پەرستراو، بەلگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ:﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ

وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ئەی خەڵكینە هەر ئەو خوایە بپەرستن، كە ئێوە و زۆری تریشی پێش ئێوە وەدیهێناوە، بەشكو خۆتان بپارێزن، ئەو خودایە زەوی بۆ كردون بەڕایەخ، ئاسمانی بۆ بەرزكردنەوەو ئاوێكی لەو حەوایەوە بۆ باراندن؛ هەمو جۆرە بەروبوی ـ بە هۆی ئاوەوە ـ بۆ ڕواندن، دەی كە ئەوەت زانیوە، چۆن شەریك بۆ ئەو خوایە پەیدا دەكەن؟﴾ البقرة: ٢١ـ ٢٢.

ئیبن كەثیر گوتوویەتی: هەر بەدیهێنەری ئەم شتانە، شایستەی پەرستن و بەندایەتی بۆ كردنە.

جۆرەكـانى خـوا پەرسـتى، كـە خـوا فـەرمانى پێكـردوە، وەك ئيـسلام و ئيمـان و، چـاكەو دوعـاو تـرس و داواو ئـاوات و، پـشت بەسـتن و ملكەچـى و گەڕانـەوەو، داواى يارمـەتى كـردن و هـاوار كـردن و سـەربڕين و نـەزرو، شـتى ديكـە، لـەو جـۆرە خواپەرسـتيانەيە، كـە خـوا فـەرمانيكردوە، هـەر هەمووى بـۆ خـوا بێـت، بەلگـەش فەرمايـشتى خـواى گەورەيە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ... مزگەوتەكان هـى خـودان، لەگـەڵ خـوا هاوارى كەس مەكەن﴾ الجن: ١٨

جا هەر كەسێ شتێك لەوانەى باسكرا بـۆ غـەيرى خـودا بكـات؛ ئەوكەسـە بـێ بـڕواو كـافرە، بەلگـەش ئايـەتى: ﴿ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ... هەر كەسێكيش وێڕايى خودا هانا بۆ كەسێكى تر بـەرێ

و بەلگەش لە دەستا نەبێ، پەروەردگاری دەیکێشێتە پای حیساب و ئەو پێ نەزانانە هەرگیز ڕزگار نابن﴾ المؤمنون: ١١٧

لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ هاتووە، کە (الدعاء مُخُّ العِبادة... نزاو دوعا مۆخ و پوختەی عیبادەتە)[١].
بەلگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ:
﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ...
پەروەردگارتان گوتویە: لە بەرم بپارێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم. ئەو کەسانەی ـ هەر لەبەر خۆ بەزل زانین ـ نایەنەوێ بمپەرستن، بەزەبونی دەچنە دوڕ جەهەندەمەوە﴾ غافر: ٦٠.

---

١ـ ئەم فەرمودەیە ترمذی گێڕاویەتەوەو لاوازە(ضعیف)ە بڕوانە: (الضعیف) الجامع(٣٠٠٣)بەڵام بێژە(لفظ)ی الدعاء هو العبادة ... نزاو دوعا، خۆی عیبادەتە) بە (صحیح) هاتووە. أخرجه الأربعة، وأحمد وغيرهم وصححه الألباني. جامع شروح الأصول الثلاثة لمجموعة علماء ص ٣١٠ دار الإيمان(وەرگێر)

بەلگەی ترسانیش بریتیە لە فەرمایشتی خوا: ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ... ئێوە لە وان ترستان نەبێ و، ئەگەر بڕوادارن دەبێ هەر تەنها لەمن بترسن﴾آل عمران: ١٧٥

بەلگەی داواو هیواو ئاوات دەبێ هەر لە خوابێ بریتیە لە فەرمایشتی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ... هەرکێ لەنگۆ بۆ دیداری پەروەردگاری بە ئاواتە، باکاری چاك بکاو لە غەیری پەروەردگاری خۆی هیچ کەسی دیکە نەپەرستێ﴾ الکهف: ١١٠

بەلگەی پشت بەستن بریتیە لە فەرمایشتی خوای گەورە، کە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ... ئەگەر ئێوە، بڕواتان بە خودا هەیە، پشت بە خودا ببەستن﴾المائدة: ٢٣﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ

عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ... هەرکەسێ خوای بە خوا بسپێرێ و پشتی پێ ببەستێ، ئەوی بەسە﴾الطلاق:٣

بەلگەی هیواو هومێد و ترس و ملکەچی، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ... بە هومێدو بەترسەوە لە بەرمان دەپاڕێنەوە و لەئاست ئێمە ملکەچ بون﴾الأنبياء: ٩٠

بەلگەی گەڕانەوە، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ... بگەڕێنەوە لای پەروەردگاری خۆتان و ملکەچی ئەوبن﴾الزمر: ٥٤

بەلگەی داوای یارمەتیکردن، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ ... هەر تۆ

دەپەرستین و داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین...﴾الفاتحة: ٥

لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا هاتووە: ((إذا استعنت فاستعن بالله ... گەر داوای یارمەتیت کرد؛ داوای یارمەتی لە خوا بکە))

بەلگەی خۆ پەنادان بەخوا، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ:﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ بلێ: پەنادەگرم بەم پەروەردگارەی، کە بەرەبەیان پێشدەهێنێت﴾ الفلق: ١ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ بلێ: پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵك﴾ الناس: ١

بەلگەی هانا بردن، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ ... لەو کاتەدا، کە هاناتان بۆ پەروەردگارتان دەبرد، ئەویش وەلامی دانەوە﴾الأنفال:٩

بەلگەی سەربڕین(قوربانی) فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ (١٦٣)﴾... بڵێ: من نوێژکردنم و ڕێوشوێنی حەج کردنم و ژین و مەرگم ، بۆ خودایە، کە پەروەردگاری دنیایە، هەر خۆیەتی، خودا هیچ شەریکی نیە، فەرمانم بەمە پێکراوە، من لە ڕیزی موسڵمانان یەکەمینم﴾الأنعام: ١٦٢ــ ١٦٣.

لە فەرمودەی پێغەمبەریش ﷺ هاتووە، کە فەرمویەتی: ((لعن الله من ذبح لغيرالله... نەفرەتی خوا لەو کەسەبێ، بۆ غەیری خوا ئاژەڵ سەرببڕێ[١])).

---

١ـ ئیمامی نەوەوی لە شەرحی ئەم فەرمودەیە: ((لعن الله من ذبح لغيرالله)). گوتویەتی: مەبەست لە سەربڕین بۆ غەیری خوا ئەوەیە، کە بە ناوی خواسەر نەبڕێ و بەناوی شتی دیکە سەر ببڕێ؛ وەك سەربڕین بۆ بت، یان بۆ خاچ، یان بۆ موسا یان بۆ

بەلگەی لە خۆگرتن(نـذر) فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ... هەرچی لە خۆ دەگرن دەیکەن؛ ترسیشیان لە ڕۆژێ هەیە، کە بەلاکەی پەرش و بلاو دەبێتەوە﴾ الإنسان: ٧

---

عیسا، یان بۆ کەعبەو هاوشێوەیان، جا سەربڕین بۆ ئەمانە گشتی حەرامەو، ئەم سەربڕاوە حەلاڵ نیە، با سەربڕەکە موسڵمان بێت، یان جولەکەو دیان بێت، ئەمەش قسەی شافعی و هاوڕێیانمانەو لەسەری هاودەنگن، جا ئەگەر لەگەڵ سەربڕینەکە مەبەستی پێ بەگەورەدانانی ئەوکەسە بێت، کە بۆی سەربڕاوە لە غەیری خواو مەبەستی پەرستن بێت، ئەوا ئەوکارە کوفرە، ئەگەر ئەوکەسەی ئاژەڵەکە سەردەبڕێ موسڵمان بێت، ئەوا بەو سەربڕینە مورتەد دەبێت.(شرح المسلم للإمام النووی/١٣/ ١٤١) کتاب الأضاحي، شرح الأصول لثلاثة محمد حسان، ص ٢١٤وەرگێر

## بنەمای دووەم :

ناسینی ئاینی ئیسلام بەبەڵگەوە، کە بریتیە لە نواندنی ملکەچی بۆ خوا، ئەویش بەیەکخواپەرستی و، تاعەت بۆ کردنی و، شەریك برپیار نەدان و خۆ پاکردنەوە لە بەشەکانی شەریك و هاوبەش دانان دێتەدی.

ئیسلامیش سێ پلەی هەیە: (ئیسلام)و (ئیمان)و (ئیحسان)، هەر پلەیەکیش لەوانە چەند پایەکی هەیە.پایەکانی ئیسلام پێنجن:

١ـ شایەتمان (شهادة أن لا إله إلا الله وأنَّ محمد رسول الله... شایەتیدان، کە جگە لە خوا هیچ کەس و شتێك شایەنی پەرستن نین و، محمدیش نێردراوی خوایە).

٢ـ پەرپاكردنى نوێژ.

٣ـ زەكات دان.

٤ـ ڕۆژوگرتنى مانگى ڕەمزان.

٥ـ حەج كردن.

بەڵگەى شايەتمان، فەرمايشتى خواى گەورەيە، كە دەفـــەرموێ: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ... خـــوا شـــايەتى داوەو فريـــشتەكانى ئـــەويش و زانايانى به ئينسافيش باش دەزانن، كـە هـيچ كـەس جگە لە خودا، شياوى پەرستن نيـە و هـەر خۆيـەتى بە دەسـەڵاتى لـە كـارزان﴾ آل عـمـران: ١٨. بـە واتـاى جگە لە خواى تاك و تەنها، هيچ پەرستراوێكى حەق نيەو، پەرستن هەر بۆ خـواى تاكـەو، لـە پەرسـتنيدا، نابێ شەريكى بۆ برپـار بـدرێ، هـەروەها لـە موڵكـيدا شـەريكى نيـە. لێكدانـەوەو ڕافەكەشـى، ئـەم ئايەتـە

ڕونـى دەکاتـەوە: ﴿قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾...

ئیبراهیم بە باب و هۆزەکەی خۆی گوت: مـن بێـزارم لـەوەی ئێـوە دەیپەرسـتن؛ مـەگین لـە کەسـێ منـی دروستکردوە؛ کە خـۆی ڕێگـەم نیـشان دەدا. کـارێکی کردئەم وتارەی لە پاش خـۆی بـۆ نەتەوەکـەی هـەر بمێنـێ؛ بـەڵکو بپرینگێنـەوە) الزخـروف: ٢٦ــــ ٢٨

هــەروەها ئایـــەتی: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ... بڵـێ: ئێـوەی ئـەهلی کتێـب! دەسـاوەرن ئێمـەو ئێوە لەسـەر ئـەو قـسەیە

سوربین، كه بۆ هەمومان وەك یەكە: غەیری خوا نەپەرستن، هاوكاری بۆ پەیدانەكەین، نەچین هێندێكمان هێندێكان جیا لە خوا بۆ پەرستن هەڵبژێرین، جا ئەگەر هەر خۆیان لێ بوارد، پێیان بێژە؛ ئێوە بەشایەتی دەگرم، كە ئێمە ملكەچی خواین﴾آل عمران: ٦٤

بەلگەی شایەتیدان بەوەی، كە محمد پێغەمبەری خوایەﷺ، فەرمایشتی خوای گەورەیە، كە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ... پێغەمبەرێك هاتە لاتان، لە خۆتانە؛ هەر بەلایەك بەسەرتان بێت، لای گرانە؛ دڵی زۆربە ئێومیە؛ دڵسۆزی باوەڕدارانەو دلۆڤانە﴾ التوبة: ١٢٨

مانای شایەتیدان، کە محمد پێغەمبەری خوایە، ئەوەیە، کە هەر فەرمانێکی کردوە، بەفەرمانی ئەو بکرێ و تاعەتی بکرێ و، هەر هەواڵێکی دەدات؛ باوەڕی پێ بکرێ و، هەرشتێك ئەو قەدەغەی کردووەو بەناشیرنی داناوە؛ خۆی لێ بەدور بخرێ و، تەنها بەو شێوەیە خوا بپەرستێ، کە ئەو دایناوە.

بەڵگەی نوێژو زەکات و لێکدانەوەی یەکخواپەرستی (توحید)، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾... فەرمانیشیان هەر ئەوەندە پێدرابو، کە دەبێ خواپەرست بن ولە دین ئەودا دڵپاك بن و بەرەو هەقانەت بڕۆن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن؛ کە ئەمە دینی دروستە). البنية : ٥

بەڵگـەی ڕۆژوگـرتنیش، فەرمایـشتی خـوای گەورەیـە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ...ئـەی گـەلی خـاوەن بـاوەڕان! بۆتـان نوسـراوە: ڕۆژو بگـرن هـەروەك لەسـەر پێـشینەکانتانیش نوسـرا بـەڵکو لـە خـوا بترسـن﴾ البقرة: ١٨٣

بەڵگـەی حـەج کـردنیش، فەرمایـشتی خـوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ... خودا حەجی بڕیارداوە بۆ هەرکەسێ، کە بۆی بلوێ، هەرکەسێکیش حاشا بکات، خـوا لـە هـەموو خەڵکی دونیا بێ نیازە﴾ آل عمران: ٩٧

پلـەی دووەم: (ئیمـان)ە: ئیمـانیش حـەفتاو ئەوەنـدە لقەیـە. بـەرزترینیان گـوتنی: (لاإلـه إلا

الله)يەو كەمترينى، لابردنى شتێكە، كە ببێتە مايەى ئازار لە رێگاو، شەرميش لقێكە لە ئيمان.

پايەكانى ئيمان شەشە: ئەوانيش بريتين لەوەى،كە بروات بە خواو فريشتەكانى و كتێبەكانى و پێغەمبەرانى و رۆژى دوايى هەبێت و، بروات بەقەدەرى خوا هەبێت بەچاكەو خراپەيەوە.

بەلگەى ئەم شەش پايە، فەرمايشتى خواى گەورەيە، كە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ... كارى چاك هەر ئەوەنيە رو لە رۆژهەلاتێ بكەن، يان رۆژئاوا. چاك ئەوەيە، كەباوەرتان بە خواو رۆژى دوايى و فريشتان و كتێب و پێغەمبەرانى خودا هەبێ﴾البقرة:١٧٧ .

بەڵگەی قەدەریش، فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ... ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردوە﴾القمر:٤٩.

پلەی سێیەم: چاکە (الإحسان) یەك پایەی ئیسلامە، چاکەش ئەوەیە، کە خوا بەوشێوەیە بپەرستی، کە دەیبینی ، ئەگەر تۆ نەیبینی؛ ئەو تۆ دەبینێ، بەڵگەش فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ... بێگومان خوا لەگەڵ خۆپارێز لە گوناهان و چاکەکارانە﴾ النحل: ١٢٨ .

هەروەها فەرمایشتی: ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ ... هەر پشت بە خوای خاوەن دەسەڵاتی دلۆفان ببەستە ؛ ئەو کەسەی، کە تۆ دەبینێ، وا بە پێوە هەڵدەستی، هاتو چوشت

لەگـەڵ سـوژدەبەرەکاندا(لـە بەرچـاویە)، بیـسەرو زاناش هەر ئەوە﴾ الشعراء: ٢١٧ـ ٢٢٠.

هـەروەها ئایـەتی: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ ... ئەتۆ لە هەر بارێکدابی و هەرچی لە قورئـان بخـوێنی و هـەرکارێکی ئێـوە بیکـەن، ئێمـە لێتـــان ئاگـــادارین، کاتـــێ خـــەریکی ئـــەو کارەن﴾یونس:٦١

بەڵگـەی چـاکەکاریی لـە فـەرمودەی پێغەمبـەردا بریتیـە لـە فـەرمودەی بـاوی جوبرائیـل، کـە لـە عومەری کوڕی خەتتاب گێڕراویەتیـەوەو گوتویـەتی: ((بینما نحن عند رسول الله ﷺ ذات يوم إذ طلع علينا رجل شديد بياض الثياب شديد سواد الشعر لا يرى عليه أثر السفر ولا يعرفه منا أحد حتى جلس إلى النبي ﷺ فاسند ركبتيه إلى ركبتيه ووضع كفيه على فخذيه وقال يا

محمد أخبرني عن الإسلام فقال رسول الله ﷺ الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ﷺ وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا قال صدقت قال فعجبنا له يسأله ويصدقه قال فأخبرني عن الإيمان قال أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره قال صدقت قال فأخبرني عن الإحسان قال أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك قال فأخبرني عن الساعة قال ما المسؤول عنها بأعلم من السائل قال فأخبرني عن أمارتها قال أن تلد الأمة ربتها وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في البنيان قال: فمضى فلبثنا مليّاً فقال: يا عمر أتدري من السائل ؟ قلت الله ورسوله أعلم قال فإنه جبريل أتاكم يعلمكم دينكم...

ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر دانیشتبوین، پیاوێکی جل زۆر سپی و قژ ڕەش هاتە لامان، کە شوێنەواری ڕێبواری بەسەرەوە دیارنە بوو، کەسیش لە ئێمە نەیدەناسی، جا کە لای پێغەمبەر ﷺ

دانیشت و چۆکی به چۆکی پێغەمبەرەوە ناو دەستی خستە سەر ڕانەکانی و گوتی: محمد! دەربارەی ئیسلام هەواڵم بدەیێ، ئەویش فەرموی: شایەتی بدەی، کە جگە لە خوا هیچ کەسێ شایەنی پەرستن نیەو، محمد پێغەمبەری خوایەو، نوێژ بەرپا بکەی و زەکات بدەی و لە ڕەمەزان بە ڕۆژوبی و، گەر بۆت لوا حەج بکەیت، پیاوەکە گوتی: ڕاست دەکەی، ئێمەش سەرمان سوڕما لەوەی پرسیاری لێ دەکات و بەڕاستیشی دادەنێ. پیاوەکە گوتی: دەربارەی ئیمان هەواڵم بدەیێ، فەرموی: بڕوات بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی هەبێ و بڕوات بە قەدەر هەبێ، بەچاکەو خراپیەوە. پیاوەکە گوتی: ڕاستت گوت. گوتی: دەربارەی چاکەکاری هەواڵم بدەیێ؟ فەرموی: بەوشێوەیە خوا بپەرستی، کە دەیبینی، ئەگەر تۆش نەیبینی؛ ئەو دەتبینێ، گوتی: دەربارەی قیامەت هەواڵم بدەیێ؟ فەرموی: ئەوەی

پرسيارى لێدەكرێ له پرسياركەر زانا ترنيه، گوتى: دەربارەى نيشانەكانى هەوالْم بدەيێ فەرموى: منداڵ بەچاوى كارەكەرو خزمەتكار تەماشاى دايك و باوكى بكات و، ببينى پێخاوس و ڕوت و ڕەجاڵ و شوانى مەڕومالاْت ، خانو كۆشك و تەلار بەرز بكەن، عومەر گوتى: پياوەكە ڕۆيشت و ئێمەش ماوەيەك ماينەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموى: دەزانى ئەو كەسەى پرسيارى دەكرد كێ بوو؟ ئێمەش گوتمان : خواو پێغەمبەرەكەى دەزانن و زاناترن، فەرموى: ئەمە جوبرائيل بوو، هاتبو كاروبارى ئاينەكەتان فێر بكات.)) صحيح مسلم

## بنەمای سێیەم:

### ناسینی پێغەمبەرەکەتان، کە محمدەﷺ:

ئەو ناوی محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشمە، هاشمیش لە قورەیشەو، قورەیش لە عەرەبە، عەرەبیش لە وەچەو نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە، صەلات و سەلام لەو و لەپێغەمبەرمان بێت. پێغەمبەر تەمەنی شەست وسێ ساڵ بوە، لە تەمەنی چل ساڵی بۆتە پێغەمبەرﷺ و بیست و سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی کردوە، بە ئایەتی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِی خَلَقَ﴾ بۆتە پێغەمبەرﷺ(نبی)و بە﴿یَـٰۤأَیُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ﴾ بۆتە نێرراو(رسول)[1].

---

١ـ جیاوازی لە نێوان(نبی)و(رسول) وەك زانایان گوتویانە پێغەمبەر(نبی) ئەو کەسەیە شەرعی بە وەحی بۆ ناردراوە، بەڵام فەرمانی پێ نەکراوە بە خەڵك ڕابگەیەنێ، نێرراو(رسول)یش ئەو کەسەیە خوا شەرعی بە وەحی بۆ ناردوەو فەرمانی پێکردوە

لـه مەككـه لـه دايـك بـووەو كۆچـی بـۆ مەدينـه كردوه، خوا ناردويەتی، كه ئاگاداری خـەڵك بكاتـەوه له شيرك و هاوبەش برِياردان و بانگی خـەڵكی بكات بـۆ يـەكخوا پەرستی(توحيـد)، بەڵگـەش فەرمايـشتی خوايه، كه دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ٧﴾... ئــــەی ئــــەو كەسەی جلكت بەسەر خۆداداوه، ڕابه، تـرس وەبينـه، ڕاش گەيێنــه، كـه پـەروەردگارت مـەزن و گەورەيـه، بەرگيشت خـاوێن ڕاگـره، لـه هەرچی ناپاكه دوربـه، ئــەوەی دەيبەخــشيت بــه هــەزاران، منــەتی لەگەڵدامەكــەو بــەزۆری مەزانــه، لــه ســەر ئــەو

---

ڕايبگەيەنێ و كاری پێ بكات. جا هەموو(رسول)ێك (نبی)يه، بەڵام هەموو(نبی)يەك (رسول)نييه. جامع شروح الثلاثـة الأصول شرح مجموعة من العلماء، ويليه شرح الشيخ صالح بـن عبـدالعزيز ٢٢٨، دار إبن الجوزي(وەرگێر)

فەرمانانەی، کە لەلایەن خوداوە بۆت دێت خۆت ڕابگرە﴾ المدثر: ١ـ ٧

مانای﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾خەڵك لە شیرك و برپیاردان بترسێنێ و بۆ یەکخوا پەرستی بانگ بکات، ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾ بە هۆی یەکخواپەرستیەوە، خوا بەگەورە بگرە، ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾ یان کردەوەکانت لە شیرك پاك بکەوە، ﴿ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴾ واز لە بتەکان بهێنەو خۆتیان لێ بەری بکە.

پێغەمبەرﷺ ماوەی دەساڵ بانگەوازی بۆ یەکخواپەرستی(توحید) دەکرد، دوای دەساڵەکەش بەرەوئاسمان بەرز کرایەوە و پێنج نوێژەکانی لەسەر پێویست کرا، لە مەککە ماوەی سێ ساڵ نوێژی کرد، پاشان فەرمانی پێکرا کۆچ بۆ شاری مەدینە بکات.

كۆچ كردن(هجرة)يش بريتيه له گواستنەوه له وڵات و شارى شيرك بۆ وڵات و شارى ئيسلام، كه له سەر ئوممەت فەرزه له وڵاتى شيركەوه كۆچ بۆ وڵاتى ئيسلام بكرێت، ئەمەش هەتا ڕۆژى قيامەت بەردەوامە.

بەڵگەش لەسەر كۆچ كردن فەرمايشتى خواى گەورەيە، كه دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ...

ئەوكەسانەى هەر له جێى خۆيان مانەوەو ئەو غەدرەيان له خۆيان كرد، كاتێ فريشتەى گيان كێشان پێيان دەڵێ: ئێوه له چ بارێكدا بون؟ دەڵێن:

ئێمە لە زەمینـدا هێزو وزە لێگیراو بوین. پێیان دەڵێن: مەگەر سەر زەوینی خودا فروان نەبو، تا لە زێدی خۆتان کۆچ کەن و بڕۆنە جێگایەکی تر؟

ئەمانە دۆزەخ دەبێتە ئەنواو شوێنیان و دوارۆژی خراپیان دەبێت، مەگەر ئەو پیاوو ژن و منداڵ و هێزلێگیراوانەی هیچ دەرەتانیان نەبوبێ و بەلگەشیان نەزانیبێ، هیچ دورنیە خودا ئەمانە ببەخشێ، خودا چاوپۆشی لە لایەو بەخشندەیە﴾النساء: ٩٧ــ ٩٩.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٌ فَإِيَّـٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ... ئەی ئەوانەی خاوەن باوەڕن و خۆ بە عەبدم دەزانن! زەمینی من فراوانە، هەر تەنیا من بپەرستن﴾ العنكبوت: ٥٦

ئیمامی بەغەوی گوتوویەتی: هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە، دەربارەی ئەو موسڵمانانە بوو، کە لە

مەككە مابونەوەو كۆچيان نـەكردبوو، خوا بـە نـاوى برِوادار بانگى كردن.

بەلگـەى فـەرمودەى پێغەمبـەرﷺ بـۆ كـۆچ كـردن(هجـرة) فـەرمودەى: ((لا تنقطـع الهجـرة حتـى تنقطع التوبة، ولا تنقطع التوبة حتـى تطلـع الـشمس مـن مغربهـا .... كـۆچ كـردن نابرِێتـەوەو تـەواو نابێـت، هـەتا تەوبـەكردن كۆتـايى دێـت، تەوبـەكردنيش كۆتايى نايـەت و تـەواو نـابێ، هـەتا خـۆر لـە رِۆژئـاوا هەڵدێ))[١]

جـا كاتـێ لـە مەدينـە جێگيربـوو، فـەرمانى بـە ياسـاكانى ئيـسلام پێكـرا، وەك زەكـات و رِۆژگـرتن ، حەج كردن و، جيهادو، بانگدان و، فـەرمان بەچاكەو رِێگرى لە خراپە، هەروەها ياساكانى تـيكەى ئيسلام،

---

١ـ اخرجه أبو داود كتاب الجهاد رقم(٢٤٧٩)، والدارمي برقم (٢٥١٣)، وغيرهما من حديث معاوية، وصححه الألباني في (سنن أبي داود) (وەرگێر)

کــه مــاوەی دەســاڵی خایانــد ئینجــا دوای ئەمــه پێغەمبــەرﷺ گیــانی پــاکی بــه خــوا ســپارد، کــه ئاینەکــەی ماوەتــەوەو، ئــەم ئاینــەی، کــه هــەر خێروچاکەیەك هەیە پیشانی ئوومەتی داوەو، هەر خراپەیەك هەیە هۆشداری لە نەکردنی داوە.

ئــەو خێروچــاکەی پیــشانی داوە، بریتیــه لــه یەکخواپەرستی(توحیـد) و، هــەموو ئەوشتانەی خـوا حەزی پێ ناکات و ڕێگری کردنی دەکات.

خودا پێغەمبەری ﷺ بۆ گشت خەڵکی ناردووە و تاعــەت و بەفــەرمان کردنــی لــه ســەر ئــادەمیزاد و جنۆکە فەرزکردوە، بەڵگەش فەرمایشتی خوایە، کە دەفــــــەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ... بێــژە ئــەی خەڵکینــە: مــن پێغەمبــەری خــوام بــۆ هــەموان نــاردراوم﴾ الأعراف:١٨٥.

خـوا ئـاینی بـەو تـەواو کـردوە، بەڵگـەش ئـەم ئایەتەیــە: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ... وا لــــــەمڕۆوە دینەکـەتانم تـەواو کـردو بـەبێ کـەم و کـورتی و کەمایەسی چاکەم دەربـارەی ئێـوە کـرد؛ ئیسلامیـشم بۆ دینی ئێوە هەڵبژارد﴾ المائدة: ٣.

بەڵگــەش لەســـەر مردنـــی پێغەمبـــەرﷺ، فەرمایشتی خوایە، کە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ (٣٠) ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ... تۆش دەمری و ئەوانیش دەمرن، پاشان لـە ڕۆژی قیامـەتا کێشەی ئێـوە دێتـەوە لای پـەروەردگارتان﴾ الزمر: ٣٠ـ ٣١.

خەڵکیش، کەمردن: زینـدو دەکرێنـەوە، بەڵگـەش فەرمایـشتی خوایـە، کـە دەفـەرموێ: ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ

وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ... لــه زەویمــان دروستکردن؛ دیسان دەتانخەینــه نـاوی، جاریکی تـر لەویتان دەردەخەینەوە﴾ طه: ٥٥.

هـەروەها فەرماشتی: ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾... هــــەر خودایه ئێوەی لەم زەمینەدا ڕواند، بەڕواندن، پاشان دەوباتەوە ناوی، دیسان دەرودەکاتـەوە بـەدەرکردن﴾ نوح: ١٧ــ ١٨.

دوای زیندوبونــەش لێپرســینەوەیان لەگــەڵ دەکرێــت و پاداشــتی کردەوەکانیــان دەدرێتــەوە، بەلگەش فەرمایشتی خوایـه، کـه دەفـەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ... هەرچـی لـه نـاو ئاسمانەکان وزەمیندان، گشتی هی خودان؛ تا سزای

ئەوانـە بـدا، كـە خراپـەیان كـردوەو چـاكەی باشـیش دەربارەی كارچاكان بكا﴾ النجم: ٣١.

هەركەسێك زیندوبونەوە بەدرۆ بزانێ؛ بێ بڕواو كافرە، بەلگـەش فەرمایـشتی خوایـە، كـە دەفـەرموێ: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ... ئەوانەی خوایان نەناسی و بێ بڕوابون، پێیان وابو هەرگیز زیندو ناكرێنەوە، بێژە: ئاریێ سوێند بـە پـەروەردگاری خـۆم، بێگومـان زینـدو دەكرێنـەوە، پێـشتان دەڵـێن، كـەچ كارێكتـان كردوەو ئەمەش لای خودا هاسانە﴾ التغابن: ٧.

خـوای گـەورە گـشت پێغەمبـەرانی بـە مـژدەدەرو ترسـێنەر نـاردوە، بەلگـەش فەرمایـشتی خوایـە، كـە دەفــــەرموێ: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ.... گـشت لـە گـشتیان پێغەمبەری مژدەدەرو ترسێنەر بون. هـەتا لـە پـاش

پێغەمبەر، ئەو خەڵکە هیچ بەلگەیەکیان لە لانەبێ بۆ لای خودا﴾ النساء: ١٦٥

یەکەم: پێغەمبەر (رسول)یان (نوح)ەو، کۆتا پێغەمبەریش محمدە ﷺ، بەلگەش لەسەر ئەوەی، کە نوح عليه السلام یەکەمیانە، فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ... ئێمە فەرمانی خۆمانمان خستە دڵت، هەروەك نوح، پێغەمبەرانی دوای ویشمان تێگەیاند﴾ النساء: ١٦٣

خوا بۆ هەر نەتەوەیەك پێغەمبەرێکی ناردوە، لە نوحەوە هەتا محمد ﷺ کە فەرمانیان بەخەڵك دەکرد تەنها خوای تاقانە بپەرستن و، ڕێگریان دەکرد لە پەرستنی هەمو کەس و شتانەی لە سنور لایان داوەو، تاغوتن، بەلگەش فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ... بۆ ناو هەمو

كۆمەڵەیـەك پێغەمبـەرێكمان بـەرِێ كـرد، كـە خـوا بپەرستن و لە تاغوت دورەپەرێز بن﴾ النحل:٣٦

خـودا لەسـەر گـشت بەنـدەكانی پێویـست و فـەرز كردوە، كە بڕوایان بە تاغوت نەبێ و، بڕوایان بەخوا هەبێ.

ئیبنــو لقــەیم گوتوویــەتی: مانــای (طــاغوت) ئەوەیــە، كــە عەبــد ســنوری خــۆی ببــەزێنێ لــە پەرستراو، یـان شـوێنكەوتن، یـان بـەگوێكردن و بـەر فــەرمانكردن، طــاغوتــەكانیش زۆرن، پێنجیــان سەرەكین:

١ـ ئیبلیس(شەیتان) نەفرەتی خوای لێ بێ.

٢ـ كەسێك بپەرسترێو خۆی ڕازی بێ.

٣ـ كەسێك خەڵك بانگ بكات بۆ پەرستنی خۆی.

٤ـ كەسێك بڵێ من شتێ لە نادیار(غیب)[1] دەزانم.

---

١- ئەمـەش ئەوكەسـانە دەگرێتـەوە ، كـە هـەواڵی داهاتوو بـە درۆ دەدەن وەك فاڵچی و فـاوەگرەوەو بورجـەكان، كـە لەسـەر ڕوپـەڕی ڕۆژنامەو گۆڤارەكان بڵاودەكرێتەوە.

**٥ـ كەسێك حوكم بە غەیری قورئان بكات.**

بەلگەش فەرمایشتی خوایە، كە دەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ ... لەم دینەدا بەزۆرداسەپاندن نیە، شارەزایی لە گومڕایی هاوێرکرا. هەركێ بڕوای بە تاغوت نەبێو بڕوای بە خودا بهێنێ، دەستەگیرەیەكی هێندە توندی بەدەستەوە، هەرگیز پسانی بۆ نیە﴾ البقرة: ٢٥٦.

ئائەمەیە ماناو واتای (لا إلە إلا الله)[1]. لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە: ((رأس الأمر الإسلام، وعموده الصلاة، وذروة سنامه الجهاد في سبيل الله.... سەری ئەو ئاینەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی

---

١ـ چونكە مانای(لا إله إلا الله) بریتیە لە بڕوا نەكردن بە تاغوت و بەكوفردانانی و، بڕواها هێنان بەخوا.

ئیسلامەو، کۆڵەگەکەشی نوێژەو، لوتکەی بەرزیشی جیهادو تێکۆشانە لە پێناوی خوا))[١].

خواش زاناترە.

(وصلى الله على محمد وآله وصحبه وسلم)

---

١ــ اخرجه احمد(٥/٢٣١)، والترمذي في السنن، وابن ماجة كتاب التفسير(٢٩٧٣)، وصححه بمجموع طرقه العلامة الألبانى في (الصحيحة) برقم(١١٢٢).

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بەناوی خوای بەخشندە، خاوەنی عەرشی گەورە داواکارم لە دنیاو ڕۆژی دوایی پشتگیریت بکات و، لە هەر شوێنێك بوی پیرۆزت بکات و لەو کەسانەت دابنێ، گەر شتێکی پێ بەخشرا، سوپاست بکات و، گەر توشی ناخۆشی بوو ئارام بگرێ و، گەر گوناهیکرد، داوای لێخۆشبون لە خوا بکات، دیارە ئەم سێ شتە ناونیشانی بەختەوەرییە.

خوا ڕێنموییت بکات بۆ تاعەتکردنی، ئەوە بزانە، کە ڕێبازی پاکی ئیبراهیم ئەوەیە، کە هەر تەنها خوا بپەرستی وبەدڵپاکی لەسەر دینەکەی ئەو بی، هەر وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ... جنۆکەو ئادەمیزادم، تەنها بۆ پەرستن بەدیهێناون﴾ الذاريات: ٥٦.

جا كە زانیت خوا بۆ پەرستنی ئەو دروستی كردوی، ئەوە بزانە كە پەرستن و بەندایەتی پێی ناگوترێ عیبادەت و پەرستن، مەگەر دەبێ یەكخواپەرستی لەگەڵ بێ(تەنها هەر خوا بپەرسترێ)، هەروەها نوێژ بەبێ دەستنوێژ ،پێی ناگوترێ نوێژ، جا گەر لەگەڵ عیبادەتدا شیركی تێكەڵ بوو، وەك یە كێك وایە ،كە دەست نوێژی هەبێ و بێ دەست نوێژی بەسەردابێت.

جا كە زانیت گەر شیرك بۆ خوا بڕیاردان تێكەڵ بە عیبادەت بوو؛ عیبادەتەكە تێكدەداو كارو كردەوە بەتاڵدەكاتەوەو، خاوەنەكەی لە ئاگری دۆزەخ بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە، ئەوا بۆت دەردەكەوێ و دەزانی، كە گرنگترین شت بیزانی ئا ئەمەیە، بەڵكو خوا لەم تۆڕە، كە شیرك و هاوبەش بڕیار دانە بۆ خوا، ڕزگارت بكات، ئەو شیركەی خوا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا

دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا.... خودا لەوانە نابورێ، کە شەریکی بۆ بڕیاربدەن، جگە لەمە هەرکەسێ بۆخۆی حەزکا، لێی خۆش دەبێ و عەفوی دەکا﴾ النساء: ١١٦.

بۆ ئەوەی لە شیرك ڕزگاربیت، ئەوا چوار ڕێسا (قاعدة) هەیە دەبێ بیزانی، کە خوا لە قورئان باسی کردوە:

## ڕێسای یەکەم ( القاعدة الأولى )

ئەوە بزانی، کە ئەو بێ بڕواو کافرانەی، پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی لە دژکردن، بڕوایان بەخوا هەبو، کە خوا بە دیهێنەری بەڕێوەبەری گەردونە، بەڵام ئەم جۆرە بڕوایە نەیخستنە ناو ئیسلام، بەڵگەش فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ... ﴾

بێژە کێ لە ئاسمان و زەمینەوە ڕزق و ڕۆزیتان دەدا؟ یان خاوەنی ئەم گوێ و چاوانەتان کێ یە؟ چکەسێکیش زیندو لە مردو دەردەخاو مردو لە زیندو دەردێنێ .کێ یە بەکاران ڕادەگا؟ زو دەڵێن: خوا. بڵێ: دەی بۆلێی ناترسن؟

## ڕێسای دووەم (القاعدة الثانية)

ئەو بێ بڕوایانە دەڵێن: ئێمە، کە داوامان لەو بتانە کردو ڕومان تێیان دەکرد، تەنها بۆ نزیک بونەوەو تکاو شەفاعەتەوە بوو.

جا بەلگەی بانگەشەی بەناو نزیکبونەوە لە خوا، فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ... ئەوکەسانەی، کە لەجێ ئەو (خوا) گەورەگەلێکیان بۆ خۆیان دیوەتەوە، دەڵێن: ئێمە هەربۆیە دمیانپەرستین، تالە خوا نزیکمان کەنەوە، خوا بەو دوبەرەکایەتیە رادەگا، کە لە ناو ئەوندا هەیە، دیارە خودا مرۆڤی دەرون سپڵە، بەرەو خۆی شارمزا ناکا﴾الزمر: ٣.

بەلگەی تکاو شەفاعەتیش فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ... غەیری خودا شتانێ وادەپەرستن،

نـەزیانێكیان لێ دەدەن، نـە بـەهرەیان بۆیـان هەیـە؛ دەشـــڵێن ئەمانـــە لای خـــودا بۆمـــان دەبـــن بەتكاكار﴾یونس: ١٨

تكاو شفاعەت دووجۆری هەیە:

١ـ تكاو شفاعەتێكی نەویستراو (وەرنەگیراو).

٢ـ تكاو شفاعەتێكی سەلێنراو وەرگیراو.

تكاو شـفاعەتی نەویـستراو(وەرنـەگیراو): ئەوەیـە داوا لە غەیری خوا بكرێ، كە ئە تـەنها خـوا توانـای بەسـەردا هەیـە. بەڵگـەش فەرمایـشتی خوایـە، كـە دەفـــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خُلَّةٞ وَلَا شَفَٰعَةٞۗ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ... ئەی گەلی خـاوەن بـاوەڕان! لەو بژێوەی، كـە پـێم داون بیبەخـشن، پـێش ئـەوەی ڕۆژەكـە دابێـت ؛ كـە ئـەو ڕۆژە نـە سـەوداكردن دەمێنـێ و نـــەتكاو نەدۆســـتایەتی، خوانەناســـان ناحەقی لە خۆیان دەكەن﴾ البقرة: ٢٥٤

٢ـ شەفاعەتێكی سەلمێنراو(قبولْ كراو): ئەو شەفاعەتەیە، كە لە خودا دەخوازرێ ،خوای شەفاعەتدەریش بەشەفاعەتبەخشین پایە بەرز و شكۆدارە ، ئەو كەسەی شەفاعەتی قبولْ دەكرێ، ئەو كەسەیە،كە خوا دوای ئیزنی خۆی لە گوتەو كردەوەی ڕازی بێت، هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ... كێی واهەیە هەتا بۆ خۆی ئیزنی نەدا، بتوانێ تكای لا بكا؟﴾ البقرة: ٢٥٥

## ڕێسای سێیەم: (القاعدة الثالثة)

پێغەمبەرﷺ بەسەر خەڵكانێك ڕاگەیشت، كە عیبادەتی جیاجیان دەكرد، هەبو فریشتەی دەپەرست، هەیانبو پێغەمبەران و پیاوچاكانی دەپەرست، هەیانبو درەخت وبەردی دەپەرست، هەیانبو خۆرو مانگی دەپەرست، جا پێغەمبەری خوا

جەنگى لەدژ كردن و هيچيانى نەبوارد، بەلگەش فەرمايشتى خوايە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ... لە دژيان شەڕكەن هەتا ئاژاوە نامێنێ و دين گشتى دينى خوا دەبێ﴾ الأنفال: ٣٩

بەلگەى خۆرو مانگ فەرمايشتى خوايە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ... شەو و ڕۆژ و خۆر مانگ لە نيشانەكانى ئەون؛ نە بەرەو خۆر سوژدە بەرن، نە بەرەو مانگ؛ سوژدە بۆ خودايەك بەرن، ئەوانى وەديهێنا؛ ئەگەر هەر ئەو دەپەرستن ﴾ فصلت:٣٧

بەڵگـــەی فریـــشتەش ئایـــەتی: ﴿ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا ...فەرمانی بەوە نـەداوە، کە فریشتەو پێغەمبەران بپەرستن﴾آل عمران:٨٠

بەڵگـــەی پێغەمبـــەران ئایـــەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ...

ئەوکاتـەش، کـە خـودا گـوتی: ئـەرێ عیـسای کـوڕی مەریەم! تـۆ گوتوتـە بـەو مەردمـە ـ غـەیری خوداـ دەبـێ ئێـوە مـن ودایکـم وەك دوو خـوا بپەرسـتن؟ گوتی: پاکی و بێ عەیبی هەرشیاوی تۆیە، مـن ڕێـم ناکەوێ هیچ شتێ جگە لە ڕاستی بڵێم، ئەگەر ئـەو قـسەیەم کردبـا خـۆت دەتزانـی، هەرچییەکیـشم

بەناخی دڵدا ببوری، تۆ دەیزانی؛ تەنها منم کە دەربارەت هیچ نازانم، هەرتۆ لە هەمو نەدیاران ئاگاداری﴾ المائدة: ١١٦.

بەڵگەی چاکەکاریش ئایەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ... ئەو کەسانەی ئەوان هانایان پێ دەبەن، کامانیانە نزیکترن، بەدوای هۆ دەگەڕێن، کە بگەن بە پەروەردگاریان هیوای بەزەیی ئەویانە و جەربەزەش دەترسن﴾الإسراء: ٥٧

بەڵگەی دارو درەخت و بەردیش ئایەتی: ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ... ئاخۆ ئێوە هەرت لات و عوزاتان دیوە؟ سێهەمیشیان، کە (مەنات)ەو یەکێ تر لە بتەکانە؟﴾النجم: ١٩ـ ٢٠

هەروەها فەرمودەی ئەبی واقیدی لەیثي رضي الله عنه ، کە گوتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ حونەین دەرچوین، کە تازە لە بێ بڕوایی گەڕابوینەوە، جا موشریکەکان درەختێکیان هەبو لەلای دەمانەوە و چەکەکانیان پێوە هەڵدەواسی، کە پێیان دەگوت(ذات انواط)، ئێمەش بەدرەختێك تێپەڕبوین و گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا وەك ئەوان چۆن درەختی(ذات أنواط)یان هەیە، درەختێکی ئاوا بۆ ئێمە دەستنیشان بکە.

## ڕێسای چوارەم ( القاعدة الرابعة )

موشریکەکانی ڕۆژگاری ئێمە، لە پێشان سەر سەختترو توندترن، چونکە موشریکەکانی پێشان لە کاتی خۆشگوزەرانیدا شەریکیان بۆ خوا بڕیار دەداو لەکاتی ناخۆشیدا دڵیان لە شیرك پاك دەکردەوە،

بەڵام موشریکەکانی ڕۆژگاری ئێمە، شیرکەکەیان بەردەوامە لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا، بەڵگەش ئایەتی: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ... هەرکە سواری کەشتی دەبن، بە دڵی پاك لە بەر خوا دەپاڕێنەوە، ئەگەر خوا نەجاتی دان و گەیاندنیە سەر وشکانی، دەڵێن: خوا شەریکی هەن﴾ العنكبوت:٦٥.

(وصلى الله على محمد وآله وصحبه وسلم)

# ناوەرۆك

**ئەم نامیلکەیە**

**سێ بنەمای سەرەکی ئیسلامیت پێ دەناسێنی ، کە بریتین لە ناسینی خوای پەروەردگار و ، ناسینی پێغەمبەر و، ناسینی ئاینی ئیسلام ، کەبەبێ ئاشنابوون بەم سێ بنەمایە ، دین دانامەزرێ و بەتەواوی پەیرەو ناکرێ. بۆیە لەسەر بابای مسوڵمان پێوستە لێیان شارەزابێ و وەکو پێویست بیانناسێ.**


نوسینگەی تەفسیر

ت: 2230908 - 2221695- 2518138

موبایل: 07701387291 - 07504605122

www.al-tafseer.com

E-mail: tafseeroffice@yahoo.com

altafseer@hotmail.com